# "کۆتایی"

ئێستا خوێنەری بەڕێز پاش ئەوەی هەر دەکلیلەکەی سەرکەوتنت ناسی و ئاشنایان بوویت، هەروەها هەستت بەکاریگەری ژیانی کەسە سەرکەوتوەکان کرد کە بەهۆی ئەو ڕێنماییانەوە ڕێڕەوی ژیانیان گۆڕاوە بەرەو سەرکەوتن، هەروەها هەموو ئەو ڕێنمایانەت خرایە بەردەست بۆ ئەوەی بتوانیت ئەو کلیلانە بەڕاسترین ڕێگا بەکار بێنیت و لەژیانی ڕۆژانەتدا بەرجەستەی بکەیت بەکردەیی بۆ گەیشتن بەئامانجەکانت ... ئێستا پێویستە خۆت بڕیار بدەیت ... پێویستە بڕیاری باشتر کردنی ژیانتبدەیت بۆ بەرزترین ئاستی بەرچاو ... هەموو کات و ساتێکت بەژیری و دانایی بەکاربهێنە ...پەیوەندیەکانت لەگەڵ خەڵکیدا باشتر و چاکتر بکە ...ژیانێکی ئاسودەتر بژی وەك ئەوەی کەشایانی خۆت بێت .. ئامانجەکانت دەست نیشان بکە ... هەمووهەوڵ و تێکۆشانت بخەرە گەڕ بۆ بەدیهێنانی خۆزگەکانت ... بڕیاربدە کەڕوو بەڕووی هەموو لەمپەر و شکستەکان ببیتەوە و بەئازایەتی خۆت تێکیان بشکێنیت.

لەیادت نەچێت هەمیشە:

زستان سەرەتای هاوینە

تاریکی سەرەتای ڕووناکیە

زەبروزەنگ سەرەتای بەختەوەریە

شکست سەرەتای سەرکەوتنە

من داوای ((بەختێکی باش ) ت بۆ ناکەم بەڵکو پێویستە خۆت بکەویتە جوڵەو کار بۆ بەخت و چارەنووسی خۆت بکەیت.

بەرێگایەکی پۆزەتیف و ئەرێنی بیرکەرەوە، هەروەها دیسان بەرێگایەکی ئەرێنی هەڵس و کەوت بکە، باشترین پێش بینی بکە لەژیانتدا. لەگەڵ ئەو پەڕی رێز و خۆشەویستی بۆ هەموو لایەك و هاتنەدی خەونەکانتان و گەیشتن بەسەرکەوتنی هەمووناواتەکان .

**هەمیشە با لە یادت بێت:**

**ئەو چرکە ساتەی کە تیایدا دەژیت، وابزانە دوا چرکەساتی ژیانتە،**

**بە باوەڕوە بژی، بە هیواوە بژی،**

**بە خۆشەویستیەوەبژی، بەتێکۆشانەوە بژی،**

نرخی ژیان بزانە.

**__کۆتایی کتێبەکە__**



# TEN KEYS FOR SOCCESS

## لەم کتێبەدا

نوسەرو وانەبێژی جیهانی "د. ئیبراهیم فەقێ" لەم کتێبەدا پەلکێشت دەکات بۆ...

★ چەند دۆزینەوە و ڕێنماییەك کەدەبێتە ڕێنیشاندەرت تاکو ببیتە کەسێکی بەپەرۆش و بەتەنگەوەهاتوو لەهەموو بارێکدا.

★ دەبیتە کەسێکی خاوەن پلان و دەشتوانیت پارێزگاری لە پەرۆشی و کارامەیی خۆت بکەیت.

★ پلەی بڕواو متمانە بەخۆبوونت بەرز دەبێتەوە و لەهەر چرکە ساتێکدا بتەوێت وزەو تواناکانت دەخەیتە گەڕ.

★نهێنییەکانی هێزی پابەندبوون "ئیلتیزام"و پراکتیك و بیرکردنەوەی نەرێنی و پێشبینی و ئەندێشەکانت فێر دەکات و چۆنیەتی بەکارهێنانیشیانت لەژیانی رۆژانەتدا بۆ شیتەڵ دەکات، تا ئەوکاتەی دەگەیتە بەرزترین ئاستی سەرکەوتن و سەرفرازی.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٤٠٠٠) دینار